

# یەکێتیی نووسەرانی کورد

## مەڵبەندی گشتی 66


ناوی کتێب: راسپاردە

نووسینی: جەعفەر شێخولیسلامی

چاپی یەکەم، 2013، هەولێر

دەرهێنانی هونەری: ستار قەرەداغی

دیزاینی سەربەرگ و پشتبەرگ: سەیوان سەعیدیان

چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات- هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٠٨) ساڵی (2013)ی پێدراوە

# ناوەرۆک

## شەختە[1]

"پێشسوارەکانمان قورس و ناوەستان" (هێمن)

لابایەک بووی
سەودای شەماڵبوونت لە سەردا بوو.
چونکە گەلاوێژ بێشکەت بوو
نەبڕایەوە لەو شەختەی کە بە ساوایی
دەمارەکانتی ئەستوور کرد.

پێیان گوتی،
هاواریان کرد:
بەفر و شەماڵ لە گەڵ یەک هەڵناکەن.
گوێت ئاخنی و
کردتە پەرژینی خۆت و لێڕەوار
پەڕەی ئاڵی ئەو لالەیەی لە خاکەلێوەدا هەڵیانواسی.

بەڕووی سەوداسەری بەهار
شنەی عەشقی خۆی ناسدەکا.
لە ئاڵۆزیی ڕێگاکانی ئەم دارستانەیە

---

[1] ئەم شێعرە لە کۆمەڵە شێعری یەکەمیشم دا بڵاو بۆتەوە (چیا و کۆچ و چەمەر، 1991، کەنەدا، لاپەڕ 104-105). بە مەبەستی تایبەت، بە دەسکارییەوە، دیسان لێرەدا بڵاوم کردۆتەوە.

کە چوونت چەشنی هاتنت
لە رەمز و رازان ژاوەی دێ.

2006/1989

## پەردە[2]

"بۆن بە دەمتەوە دەکەن
"نەکا گوتبێتت:
"خۆشم دەوێی"
(ئەحمەد شاملوو)

هەر بڕوانی
ورد ورد چاوت دەپشکنن،
نەکا وێنەی چەند جوانێکی هەڵگرتبن.
چاوەکانت—چاوەی هەتاو—
لە ژێر پەردەی ئیشارەدا بشارەوە!
من و تۆ راهاتووین بە خوێندنەوەی ئەودیوی پەردەکان.

هەر شل بڕۆی
بەند بەند باڵات تێکدەشکێنن.
باڵات لە باڵام ئاڵێنە!
بڵا بەڵاگێڕەوەت بێ باڵای لالۆی وڵاتی بێئاڵا.

---

[2] ئەم شێعرە لە کۆمەڵە شێعری یەکەمیشم دا بڵاو بۆتەوە (چیا و کۆچ و چەمەر، 1991، کەنەدا، لاپەڕ 47-46)، بەڵام زۆر ئاڵوگۆڕم بە سەردا هێناوە، بە مەبەستی نیشاندانی گۆڕان لە بۆچوونەکانم دا سەبارەت بە بوون، نەبوون، چۆن بوون و چۆن نەبوونی نیگا، باڵا، قژ و دەم.

هەر سەر رووت کەی
تا تا بسکت هەڵدەپاچن.
بسکەکانت بدە بە شەو،
با رەشتر بێ و
شوێنی متمانە و شاردنەوە
بۆ رۆژی شەرمەزار و راونراو.

بەڵام،
دەمت مەشارەوە
ئەگەر رۆژێ سەت جارانیش بڵێی خۆشم دەوێی!

لە گەڵ دەمت هیچ ناکرێ:
چرۆیەکە نەپشکوتووە و
بە هەر چاوێک ماچ ناکرێ.

تاران 1986، نووسینەوەی 2005 (کەنەدا)

## بەرەو مەهاباد

بیری دووریت ئەزموونێکە تێیدا دەتوێمەوە.
خەیاڵی دیتنەوەت کۆڵانێکی تەنگەبەرە
لە دەستانم وەئامان دێ
هێندە تێیدا دەخولێمەوە...

ئەوا دیسان ئەمشەو
چەند خەیاڵێک بە فرمێسک و داخ و وشە دەهۆنمەوە،
دەفرێک لە تاڵایی گۆمەکەی ورمێ هەڵدەدەم،
بە حەسرەتی زەنگی تەلەفوون و
ترپەی پێی پۆستەچی لە سۆزیی دا،
بە نابەدڵیی، سەری کەساس دەنێمەوە.

بەری بەیان،
لە نێوانی خەو و وشیاریدا،
ورتەم هەر دێ:
"بەرەو سابڵاخ
رۆژێک
ملی رێگا دەگرمەوە.

1992-1-8

## پشکنین

"آی عشق، آی عشق
رنگ آشنای چهره‌ات پیدا نیست"
(ئه‌حمه‌د شاملوو)

نه بیانوویه‌ک بۆ مانه‌وه،
نه به‌ڵگه‌یه‌ک بۆ رۆیشتن،
نه وارێک بۆ گه‌ڕانه‌وه،
نه شوێنێک بۆ حه‌سانه‌وه؛
ته‌نیا دووپاته‌بوونه‌وه‌ی وه‌ڕه‌زکه‌ری رۆژ و شه‌وگه‌ل.

له‌ش ده‌ده‌مه به‌ر قه‌مچی ته‌زووی به‌یانی پاییزان
له گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌کانی ماڵ له ده‌م شه‌قامه‌کانی ئۆتاوا،
به‌ڵکوو هه‌ستت پێبکه‌م له بووژانه‌وه‌ی
بیره سووره‌که‌ی گۆریندا.
ئاوه‌نگی کیژه شه‌رمنه‌کان ده‌بم،
به‌ڵکوو جارێکی دیکه‌ش ده‌سته‌مۆت که‌م
له روانینێکی پڕ له متمانه و نیاز دا.
بۆ ئاواره‌کانی کۆڕه‌و گوێ هه‌ڵده‌خه‌م
به‌ڵکوو له ته‌ک خۆیان هێنابیانی بۆ هه‌نده‌ران.
حه‌قده‌ستی کرێکاریم به قورگی ته‌له‌فوون دا ده‌که‌م،

بەڵكوو
گوێم لە سرتەت بێ لە موكریانەوە...

شێعرەكانم دێنە رەدایە
لە كورتەی كازیوەی سرتەی یادی تۆدا.
ماڵاواییم لێدەكەن
لە درێژایی تاپۆی دەنگدانەوەی بێدەنگیتدا.

ئاخ خۆشەویستیی!
چۆنت خۆ لێ بزر كردووم.

1993-09

# ژیننامە

لەدایکبوونم ژانێک بوو
دایکم بە تەنیا تاقی کردەوە.

باوکم لە راو بوو ئەو رۆژە.
خوشکم شایی لە دڵدا دەگەڕا:
رقی باوک و براگەورەکانی
بە من دەرکا.

من هەر زۆر زوو جەهەندەمم بینی،
لەو تەندوورەدا
کە دایکم هەتا نێوقەد تێیدا شۆڕ دەبۆوە،
هەتا بەشەنانی من نەسووتێ.
بەهەشتیش دووکانە شڕەکەی سەری کۆڵان بوو
بامێ و زولووبیاکەی متفەڕکی بەربانگەکانی رەمەزان.

مێرمنداڵیم؟
من لەبەر گەورەکانم هەڵدەستام،

سوڵتانی خوشکە بچووکەکانم بووم و
شێعری کلاسیکم باش ئەزبەر دەکرد.
من نە مارکسم دەناسی، نە ئەرەستوو، نە هیتلەر،
نە گاندی، نە قازی، نە خانی.
دڵخۆشیم ئەمە بوو
لە گەڵ کوڕی حەمەرەزاشا،
بە شەوێك لە دایك ببووم و
شوێنی سەرم وەکوو ئەو دادێنا.
(پوورێکم هەمیشە ئەمەی وەبیر دێنامەوە).

* * *

خاتوونەکەم!
بملاوێنەوە ! بملاوێنەوە! با لە لاویم بدوێم؛
بڵا چیرۆکی ئەوانەت بۆ بگێڕمەوە کە
بەختیان رەشتر لە چاویان بوو.
بڵا لەو راستەقینانە بدوێم
کە لای دەستەخوشك و دەستەبرا
بە ناوی خەون درکان.
بملاوێنەوە!
با لەو سەردەمانە بدوێم
خۆشەویستی مەرگی لەبەر دەچوو،
نەریت بنێشتێکی بۆگەنی کەونارا بوو
کۆلکەمەلا و شێخەکان دەیانجووتەوە.

ئەو سەردەمانەی
گوڵاڵەکان نەزانییان پێ مەست دەبوو،
چرۆکان هەوەسیان لە سەر دەبرژا و
ناوەخت، بێ وەخت، ساوا، بە زۆر هەڵدەپرووکان.
ئەو سەردەمانەی
خوشکەکان براکانیان پەست دەکرد،
پاشی ئەوەی کردیان ئەوەی پێیان گوترابوو بڤەیە.
ئەو سەردەمانەی
پیاوەکان ناپیاو بوون،
کیژەکان رەنجەڕۆ،
منداڵەکان دەعبای بێدەستەڵات و دەستەمۆ.
ئەو سەردەمانەی
ژن دەفرۆشرا،
خۆفرۆش سەرپەل بوون،
ماملەچی سەرۆك و
نیشتمان بە زۆری بەشوو دراو.
بملاوێنەوە !
با بۆت بدوێم لەو سەردەمانەی کە
شەوەکان درێژ بوون وەك مێژووی چەوسانەوە،
رۆژەکانیش کورت وەکوو دەستەکانی من...

من خەڵکی ئەو وڵاتەم کە تێیدا
نە کەس لە منی پرسی بۆ کۆچپێدان،

نە کەس لە دارەکان بۆ بڕین،
نە کەس لە کیژۆڵەکان بۆ بەشوودان.

وڵاتەکەم کاڵوکرچە.
بێوڵاتان لە دەرەوە، بە ناوی دڵسۆزییەوە،
سەرۆکەکانیش لە ناوەوە و
لە پشت پەردەی کوردایەتییەوە,
لاقەی دەکەن.
نووسەرانی سەربەست و بێ حیزبیش پێی هەڵدەڵێن.

لە وڵاتی من
شاعیرەکان بە خەیاڵ بەڕێدەچن،
شێخەکان بە چاوبەستن،
سیاسییەکان بە بازرگانی،
منداڵەکان بە زللە و،
ژنەکان بە بێمافی.

لەو وڵاتە هیچی ئەوتۆم پێ شك نایە تاسەی بکەم،
بێجگە لە دڵسۆزیی دایك و بابم،
چەند هاوڕێیەك،
دەسگیرانەکەم،
ئەو رۆژانەی دژی زۆرداریی دەنگم هەڵبڕی،
ئەو کێوانەش

کە بۆ چاوی کاڵی هیچکەسێک
نە لە باڵایان کەم بۆوە و نە ڕەنگیان گۆڕی.

من نە تاسەی دیمەنی کەپرە تەپیوەکان دەکەم،
نە منداڵە چڵمنەکان،
نە بێکارەکان،
نە بێماڵەکان و
نە تاسەی خەوتن لە نێو کێچ و ئەسپێکانی
مزگەوتەکەی ئەشکان.

من بزر بووم خاتوون!
بزر بووم لە خۆم،
لە ئەو،
لە تۆ،
لە نێو ئوتووبانە چەند هێڵییەکاندا بزر بووم، خاتوون!
من تاسەی ئەو کۆڵانە تەنگە دەکەم
کە دەمزانی هەموو بەیانییان
لە ئاستی کامە دەرگا
گەورەکچی دراوسێمان شانی لە شانم دەدا.

من وەڕەز بووم خاتوون!
من وەڕەز بووم هێندەی دەقی بێناو
لە سەر شاشەی کەمپیوتێرەکەم بخوێنمەوە.

من تاسەی ئەو نامانە دەکەم
هەموو شەوێ، سەرلەنوێ  دەنووسرانەوە،
پاشی ئەوە  کە نەدرا بوون بە تۆ،
هەموو رۆژێش دەیانکرێوە
ئابڕووی ئەو کتێبانەی فێرگە
کە پڕ بوون لە درۆ.

من تاسەبارم خاتوون !
من تاسەی  خۆم دەکەم،
ئەو خۆمەی لەوێ جێما،
ئەو خۆمەی لێرە لە خۆم دەگەڕێ،
ئەو خۆمەی نە منی دوێنێیە،
نە منی سبەینێش دەمێنێتەوە.

من تاسەی نیشتمانێک دەکەم کە لەودا
شۆڕشگێڕیی
بە سمێڵی فش و دروشمی دەمپڕکەر
پێناسە ناکرێ،
ئەو وڵاتەی کە خەڵکەکەی ناترسن
رێگایەك ببڕن
کە تا ئێستا هیچکەس نەیبڕیوە...

ئاخ، کە وشەکان بە وشیاریی

چەند ناوشیار دەمخوێننەوە...

مەیخانەکان هەر ئاوەڵان خاتوون!
کۆپڵە شێعرەکەی تی. ئێس. ئیلیەتم لۆ وەخوێنە!
دەست بکە ناو قۆڵمەوە با بڕۆین من و تۆ
بۆ ئەو قوژبنە چڵکن و دووکەڵاوییەی گۆرین:
شەرممان لە دوو دەفری تاڵدا بتوێنینەوە،
گەر دەتەوێ نەترسم لە رووتبوونەوە
لە بەردەم چەقۆی نەشتەرگەریی پرسیارەکانتدا.
با بڕۆین خاتوون!
گەر تامەزرۆی بیستنی:

نیشتمانێك خەیاڵمە و
خەیاڵیشم بێنیشتمانی.

خاکەلێوەی 1994

## من و شێعر

شێعرم نووسی
نەک بۆ ئەوە کە ناوبەدەرەوە بم،
بەڵکوو بۆ ئەوە کە ناوی خۆم لە بیر نەچێ.

شێعرم نووسی
نەک بۆ ئەوە کە ببنە دروشمی سیاسییەکی بازرگان،
بەڵکوو بۆ ئەوە کە ببمە خزمەتکاری عەشق.

شێعرم نووسی
نەک بۆ ئەوە کە گوێی کەرێک
بکەم بە گۆڕی رازە رازاوەکانی پاییزی زێدە زیزەکەم،
بەڵکوو بۆ ئەوە کە زەردەپەڕەکان بزر نەبن، نەدزرێن.

شێعرم نووسی
نەک بۆ ئەوە کە رستەکان
ببنە پردی پەڕینەوە بۆ هەرێمی بەختەوەریی،
بەڵکوو بۆ ئەوە کە خەونەکان بخەملێن.

شێعرم نووسی
نەک بۆ ئەوە کە شێعرەکان بنووسم،
بەڵکوو بەو هیوایە کە بۆ جارێک،
تەنیا جارێک
شێعرێک
من
بنووسێ.

ڕەشەمەی 1995

## کە تۆ هاتی

کە تۆ هاتی
تەنیا نەبووی:
لە چاوەکانتدا بەندی سابڵاغ و
لە سینگت دا ئاخی هەشتساڵانەت
لەگەڵ خۆ هێنابوو.
هەر بۆیەش بوو کە دابەزی
ڕێژنەی فرمێسک
بە دەم پشووی بەتاسەوەی هەناسە و ئاهەوە
تەڕی کردین.

من ڕابردووم لە ئێستەتدا،
گەڕانەوەم لە کۆچتدا،
ریشەکانم لە ئەنگوستەکانتدا و
سیمای ونبووم لە روخساری دیتراوەتدا
دۆزییەوە.

ئاوێنەی چاوەکانت لێڵ مەکە!
دەبا خۆمی جاران ببینمەوە.
دەبا بە یادی ژوانێکی بە دزیی
نیشتمانم لە نێو خۆمدا بژێنمەوە.

پاییزی 1995

## ئەمساڵ نا، ساڵێکی تر

دارەبەڕوویەکم
لە نێو تەڕەزن هەڵناکەم و
هەر لە خەمی خاکوخۆڵی لێڕەوارێکە
ڕەگم وردە وردە دەڕزێن.

خاسەکەوێکم
بە دەشتایی ڕانایەم و
هەر بە تاسەی فڕین لەم یاڵ بۆ ئەو یاڵی چیایەکە
کە تیژەباڵم لێ دەڕوێن.

کوردێکم لە گەڵ کریسمەس گەورە نەبووم و
هەر بە ئاواتی نەورۆزێکی دیکە لە وڵاتە
شەوەکانم دێن،
ڕۆژەکانم هەڵدێن.

نەورۆزی 1997

## تۆ

بێ تۆ،
ئەم دنیایە چەند بەرتەسکە.

دەردی دڵم پرێسکەی سواڵکەرێکی گوێ پێ نەدراوە.
تێگەیشتن چەندە ئەستێور ماوەتەوە.

هەنگاوەکانم لە رۆیشتن شەرمەزار دەبنەوە.
چەندە هەتڵە و کوێرن رێگاکان.

تەمی هەیبەتسوڵتان، ئاگریی و لەند لە سەر سەرمن.
چەندە نەوی هەڵدەکا، ئەم رۆژانە، شەماڵ.

هەر تەنیا چاوەکانی تۆ
هیوای رۆژێکی دیکەم پێدەدەن!
چەند دڵاوای!
چەندە نزیکی لە خەونەکانم تۆ!

1997-05-30

# مەرگی زانین

مردبووم بەر لەوە کە لە دایک بم.
هەر بۆیەشە رۆژێک دەمرمەوە.
هەر بۆیەشە دایکم هێندە خۆشدەوێ.

ژیان بەس یەکجارە:
هەر ئەو ساتەی پێدەزانین ئێمە کێین.
بەڵام، مردن دوو جارە:
ئەو ساتەی کە دەزانین کە نازانین ئێمە کێین.
ئەو ساتەش کە ئیتر نازانین کە نازانین ئێمە کێین.

1997-05-31

## پرسیار

ئەوانەی لە مێژوو نازانن هەڵە کۆنەکان دووپات دەکەنەوە.
ئەوانەش کە لێی دەزانن
هەڵەی نوێتر دەکەن.

دەبا ئەوەندە ئاوڕ نەدەینەوە
کە ڕێگای ئەمڕۆمان لێ هەتڵە بێ.
دەبا ئەوەندە لە ڕاستبوونی مەنزڵمان دڵنیا نەبین
کە لە بیرمان بچێتەوە لە کوێوە دێین.
دەبا بەس بۆ دوورەدەست بڕوانین
بەرلەوە کە دڵنیا بین لە بەرپێی خۆمان.

دەبا من لە دەستەکانی تۆ ورد ببمەوە،
تۆش لە دەستەکانی من.
دەبا هەست بە چڵڵێدانی ڕەگی دەستت بکەم.
دەبا شوێنی هەموو ئەو دەستانەی درێژ دەبنەوە
لە دەستی مندا هەڵبگری.

هەتا دەستەکانت نەناسی و نەزانی بۆ تەنیان،
هەتا دەستەکانم نەناسم و
نەزانم بۆ و بۆ کوێ درێژ دەکرێن،
چۆن بزانین پەنجەکانمان بۆچی گرێ دەدرێن؟
چۆن بزانین مستەکانمان چۆن
لە نێو دەستی لە یەکترتێگەیشتن دا
ئارام دەگرن؟

دەبا گوێ رابگرین
زۆرتر لەوەی دەدوێین!
پرسیار بکەین
زۆرتر لەوەی وەڵام دەدەینەوە!

بەهاری 1997

## زمان

زماندانی مێشکم بوو بە زێدی
ئەو وشانەی کە تۆ لایەلایەت پێکردن بۆم.
هەر بەو وشانە بوو
کە تێگەیشتم چەندەت خۆشدەوێم.
هەر بەو وشانە بوو
تۆم تێگەیاند،
خۆم دەربڕی و،
بەمجۆرە بوون بە پێناسەیەک بۆم.

کە گەورە بووم و ویستم لە خۆم بدوێم،
دەمکوت کرام؛
کەس تێمنەگەییشت؛
کەس نەیناسیم.
بەناچاری پێناسی دیکەم وەرگرتن.

ئێستا نە خۆمم، نە بێزمانم:
خۆنەناسی سەرشێواوی نێو پێناسانم...

ئەگەر زەحمەت نابێ، پێم بڵێ:
بە زمانی کامە ئەستێرە دواندمت
کە ئاوا نەناس ماومەتەوە لێرە؟
باسی هەڤاڵەتیی، دڵاوایی و حەسانەوەی
کامە ئەستێرەت بۆ کردم،
کە ئەوەندە تەنیا، تووڕە و کەساس ماومەتەوە لێرە؟
ئاخ، چۆنت بگەمێ و سەرێک وەسەر کۆشت کەم؟
ماندووم دایەگیان، ماندووم...

هاوینی 1998

## گێژەڵووکە

باش دەزانم
لە هیچ شوێنێ، قەت قەت،
ئەم دڵەی من ئۆقرە ناگرێ.

باش دەزانم
هەموو جارێ،
گژەبای پەژیوانیی بۆ ئەو شوێنەی کە جێمهێشت
بەرەو شوێنێ ترم هەڵدەدێرێ.

بەڵام، چبکەم؟
من هەر ئەوەم کە هەم— من گێژەڵووکەم:
لە هەر شوێنێک کە بم،
هەر گژەبای ئەو شوێنەی بۆ یەکەمجار لێی بڵێند بووم،
لە سەر پێ رامدەگرێ.

1998-10-18

## تاسە

کە دێیەوە
ئەلبۆمی وێنەکۆنەکانمت لە بیر نەچێ!
هەتا بڵێی تاسەی خۆم دەکەم.

کە دێیەوە
کاسێتە کۆنەکانمت لە بیر نەچێ!
هەتا بڵێی وەڕەزی دەنگی خۆم دەکەم.

کە دێیەوە
کتێبەکانمت لە بیر نەچێ!
هەتا بڵێی بێخەوی خەیاڵەکانمم.

کە دێیەوە
کراسە کۆنەکانمت لە بیر نەچێ!
هەتا بڵێی ئارەزووی بۆنی دەستوپەنجەی دایکم دەکەم.

که دێیەوە
لەسەرەخۆ بە!
ئەلبۆمەکەم،
کاسێتەکان،
کتێبەکان و
کراسەکەم
رامەتڵەکێنە!
هەتا بڵێی
تاسەی تۆزوخۆڵی سابڵاغ دەکەم.

1ی جووڵای 2001

## 88

چدەکەی
ئەگەر بزانی ئەمڕۆ دەمری؟
یەکەم تەلەفوون بۆ کێ دەکەی؟
تاسەی دواندنی کامە ئاواڵ
دەمت دەکاتە هێلانەی هەموو تکاکان؟
دواپیاسەی کام ڕێگە و بان،
پێهەڵگەڕانی  کامە یاڵ،
بیرەوەری کامە ماچ،
دەتهێنێتە هەژان؟

ئەگەر بزانی ئەمڕۆ دەمری،
سەر بە کام ماڵا دەکەی و،
لە کێوە دەسپێدەکەی بە ماڵاوایی؟
کامە خۆشەویستت ئاخرین باوەشتی پێ دەبڕێ؟
گوێی کێ دەکەی بە هێلانەی
رازە تا ئەمڕۆ نەدرکاوەکانت؟
حەز دەکەی پەنجەی کێ دوافرمێسکەکانت بۆ بسڕێ؟

ئەگەر بزانی ئەمڕۆ دەمری
چدەکەی،
لە کاتێکا
هیچکەس نەمابێ
تەنانەت تەلەفوونێکیشی لێ بکەی؟
لە کاتێکا
نە پێیەکانت لە دووت بێن و
نە هیچ شوێنێک هەبێ رووی تێبکەی؟
لە کاتێکا
هێندە پشووسوار بی
ئیتر هەناسەت هەوا وەدەنگ نەهێنێ؟
هێندە ژەهراویی بی
چاوت بە رووناکایی پێنەکەنێ؟
هێندە گێژ بی
مێشکت چیتر ژێی ژانی ژین نەژەنێ؟
لە کاتێکا نەک هەر تۆ،
بۆ تۆ
ژیان، دنیا، بۆ هەمیشە بسەکنێ؟

## راسپاردە

- "ئەلۆ"؟
- "ئەلۆ"
- " ... "
- "ئەو رۆژانە بەرەو ولآت دەچمەوە. هەر راسپاردەیەکی هەتبێ، لە سەر چاوانمی دادەنێم".
- "چاوانت خۆش. هەر خۆشی تۆم دەوێ. سەفەر بەخێر"!
- " ... "
- "بەر لە رۆیشتن دیسان تەلەفوون دەکەمەوە. مالآوا"!
- "مالآوا".

* * *

دیسانیش درۆم کرد:
"هیچ راسپاردەم نییە."

ئەی خۆزگە دەمتوانی بلێم،
هاورێ!

چاوەکانم لە گەڵ خۆت بەرەوە و
بە سەر چڵووکی "تاقەدار"ەوە هەڵیانواسە!
با وەبیریان بێتەوە
دیمەنی راخوشینی ئەستێرەکان
لە شەوی ئەنگوستەچاوی ناهومێدییی دا و
هەڵقرچانی گلێنەکان  لە سەر سێڵی ئاسمان
لە وەرزی وشکەساڵیدا،
بەڵام، نەبان نەبوون لە خەون و تاسە.

خۆزگە هاورێ دەکرا بڵێم،
باسکەکانم بەرەوە و،
لە پاڵ دارەکانی "جەنگەڵی مەسنووعی" دا بیانچەقێنە!
بڵا دەمارەکانیان
بە تەڕایی ئاوی بەندی سابڵاغ ببووژێننەوە.
با بێتەوە بیریان ملانە لە گەڵ شەپۆل،
خۆگێل کردن لە ترس،
چاو دە چاوی مەرگ بڕین و،
پەڕینەوە لە ئاوی بێڕەزا،
تەنیا بۆ سەلماندنی لەدەستهاتن.

پێیەکانم بەرەوە!
با جارێکی دیکەش فێری پیاسەکردن
لە کۆڵانە خۆڵاوییەکان ببنەوە.

بیانبەوە
با جارێکی دیکەش لە "لەندی شێخان" و "قەڵات"
وەسەر کەون،
بەڵکوو دیسان متمانە بە پتەوبوونی زەوی بکەن،
بە یادی گۆڕین، هەورازەکان کەوی بکەن.

دڵم بەرەوە و
شادی کەوە
بە کۆڵانە تەنگ و باریکەکەی "مەحموودکان"[3] و
روخساری گنجاویی و فریشتەئاسای ئەو سەیزادەی
ئێستاش چاوەڕوانی گەڕانەوەمە.
شادی کەوە بەو دەنگەی کە
گوڕ و تینی هەزاران لاوی تێدا بوو
لە "چوارڕێیانی ئازادیی" و،
بە برینی سەر سینگی ئەو دارە چنارەی "باخی مکایل"
کە یەکەم نەهێنی دڵداریمی بۆ راگرتم.

گیانم بەرەوە و
بە مەهاباد دا
کوت

[3] مەحموودکان، گەڕەکێکی مەهاباد، شوێنی ژیانی شاعیربە گەنجێتییە. دایکوباوکی شاعیر هەر نیشتەجێی ئەو گەڕەکەن.

کوت
بیگێڕە!
نە هیچ شوێنێك ببوێرە و نە هیچکەسێك،
تەنانەت زیندووەکانیش.
دەبا گیانم چەپکێك مێلاقەی "هەوشینان"،
چەپکێك بەیبوونی "هەڵگورد" و،
چەپکێك شینکەی "ئاگری"
بچێنێ لە سەر گڵکۆکەی "هێمن".
گەلێك کە گڵکۆی شاعیرەکەی بە بێ گوڵ بێ،
هێشتاکوو خۆی نەناسیوە.

هەموو چوارشەممۆیان
گیانم بەرە بۆ لای "سەرخڕێ"،
با دەستی ئەو داپیرە بگرێ و بیباتە سەر "قەبران"
بۆ سەردانی گڵکۆی "هەژار"ی کوڕی.[4]

هاوڕێم!
کە لێیان پرسی بۆچی ناچمەوە،
با بزانن: شازدە ساڵە خۆم بۆ رۆڵی یەکەمی

[4] "سەرخڕێ زۆ رتری هەموان بەشی تۆم
کۆرپەیەکی خڕەکەی باوەشی تۆم
یەکەمین شوێنی کە لێم دانا پێم
کوڕی خۆتم، بتەوێم یا نەتەوێم"-هەژار-

شانۆی گەڕانەوە
رادەهێنم.

بەڵام، چبکەم
زۆر دەترسم گەڕانەوەم
کەوڕۆ لە سەفەری گەرمێن بگێڕێتەوە و
نیشتنەوەی ناوەخت فێری مەلان بکا.
ئاخر من لە بیرم چۆتەوە
باڵم هەر بە رادەی بەرینایی رکەکەم بکەمەوە.
من لە بیرم چۆتەوە
لە ژێر پەردە دا بدوێم و
قسەکانم قووت دەم.
ئەوەی ئێستەش دەیکەم
تەنیا بۆ چاوی کاڵی شێعرە.

بە ئەوانەی سۆراغم دەگرن بڵێ:
تەمەنم لە چل تێپەڕیوە،
بەڵام دڵم هەر ئەو بیست و شەش ساڵانەیە
کە نیوەی لە مەهاباد بەجێما.
پێیان بڵێ غەریبی چەندە دڵناسکی کردووم و
چەند بە سانایی گریانم دێ،
کاتێ بە نەتەوەیەك دەگوترێ "برایان"،
بە ئاشتی و تەبایی دەگوترێ "برایەتیی" و

بە خۆکوژیش دەڵێن "براکوژی".
زۆرتر لە هەموو کەسیش بەزەییم بە ئەوانە دا دێ
کە بە کوردی نووسین بە کۆنەپەرستیی دەزانن.

هاوڕێم!
پێیان بڵێ! پێیان بڵێ!
...
*    *    *

[دوای حەوتوویەک]

- "ئەلۆ"؟
- "ئەلۆ"
- " ... "
- "بەر لە فڕین، دیسان لێت دەپرسم:
  راسپادەیەکت نییە بۆ وڵات ؟"
- "با، هاوڕێم، راسپاردەم هەیە".
- "بیڵێ! چییە؟"
  [بێدەنگی]
- "لە گەڵ خۆت بمبەوە"!

ژوئەنی 2002، کەنەدا

## بەهەشتی دەم

ئەو هەورانەی
ڕێیان کەوتە سەر دەشتی چرۆگەلت،
ئەبێ چەند ویشك بووبن،
کە باخی تامەزرۆت
ئەوەندە تینوو ماوەتەوە.

چەندە نابەڵەد بوون
ئەورێبوارانەی
چاویانت ڕوون کردەوە
بە بەرجەوەندی شاری ڕازە سەرکۆم کراوەکانت.
ئەوەتا دەروازەکانی باوێشکیان دێتێ.

چەندە جەهەندەمیی بوون ئەو گوێیانەی
دەرگای بەهەشتی دەمەکەت بۆ کردنەوە.
ئەوەتا، ئەڵێی
جریوە جریوی هەموو پاسارییەکان
بە دەرنەبڕاوەیی لە دەمتدا کۆ بۆتەوە.

بۆ پێم ناڵێی کە
ودم و کەرامەتی چەند دڵتەڕ و، چەند کلیل و،
چەند فڕینت لایە؟

چۆنت زانی هەوری سەرەبەهارم و،
تاسەباری ڕێژنە؟

چۆنت زانی ڕێبوارێکی بەڵەدم و،
تامەزرۆی ماچی گرێژنە؟

چۆنت زانی
منیش پاسارییەکی بەهەشتیم؟

چۆنت زانی؟

2002-5-01

## هەواری خاڵیی

"شەوێکی چاوەنوارِت بووم نەهاتی گیانەکەم! ویستت
منی دڵناسکی شاعیر بگێڕم ماتەمێکی تر" (هێمن)

ئەمشۆکە،
ڤیزات دا بە کامە ئاوارەی دیکە
بۆ سەفەری تاقانەی
مەڵبەندی رازە سپی و زەرد و کەسك و سوورەکانت،
کە من ئەوەندە هەست بە بێوڵاتیی دەکەم؟

ئەمشۆکە،
زایەڵەی دەنگت
گوێی کامە تامەزرۆی بیستنی تری پڕ کرد
لە شەقەی باڵی فریشتەکان،
کە ئاوا ژوورەکەی من
بوو بە کاروانسەرایەکی بێ میوان و بێدەنگ و،
تژی بێزمانیی
ژانی کچۆڵێکی بابدەرکردووی بێ ئاودەنگ؟

ئەمشۆکە،
حەزی گەمەت

لە کووچەباخی کام شێتۆکەی دیکەدا پێکەنی،
کە وەرزی پاییزی زیزبوون ئەوتۆ وزەی لێبڕیوم؟

ئەمشۆکە،
چپە و سرتەی بە سۆزت
گیانی وەبەر تێلی کەمانی
کامە هونەرمەندی تری تینووی ئیلهامدا هێنا،
کە  بە درێژایی ئەمشەوە لەبننەهاتووە
من کێشی ئەم گڕووگاڵەم  بۆ سوار نابێ؟

بۆچی نایەیتە لای من؟

هەناسەم لە  تامەزرۆیی بۆ تۆوە دێ.
وشەکانم مانا لە دەنگی تۆ قەرز دەکەن.
خوێنم شەلاڵی تاسەتە و،
ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە
بە کەڵکەڵەی تێکەڵاو بوون لە گەڵ خوێنی تۆ.

من پەرۆشی خۆم نیم
(هەر خۆمێك نەماوە هەتا پەرۆشی بم).
من لە خەمی ئەو خۆرەتاوەدام
کە بە سەر هەواری خاڵیی بەر پەنجەرەکەتدا دەکەوێ،
ئەگەر تۆ لە ماڵ نەبی.

من پەرۆشی پاسارییەکانی سەر دارتێلی کۆڵانەکەتم،
کە نازانن بەیانییباش بە کێ بڵێن،
ئەگەر تۆ بەخەبەر نەبی.

[بەردەنگ پاشماوەی ئەم شێعرەی قرتاند].

## خۆشەویستیی

کاتێ ترووسکەی ئەستێرە، ئەستێرەیەکی دوورەدەست
لێت بوو بە تیشکی خۆر.
کە گوێت نەدا بە کات و شوێن،
نە کەم، نە زۆر،
بزانە کە یەکێك، شتێکت خۆشدەوێ.

کاتێ کە هەستت کرد
هەموو شاعیرەکان بە زمانی دڵی تۆ دەدوێن.
کە گوێت نەدا بە مەوداکان و،
هەستت کرد ئەگەر حەز کەی
باڵی هەڵۆت لێ دەڕوێن،
بزانە کە یەکێك، شتێکت خۆشدەوێ.

ئەوکاتەی سوور زانیت راستی چییە،
بەڵام ویستت بڕوا بکەی بە درۆ،
حەزیشت کرد بڕوا بکەن بە وڕێنەکانی تۆ،
بزانە کە یەکێك، شتێکت خۆشدەوێ.

کاتێ بەیانییەك لە خەو هەستای،
خەونەکانی دوێنێ شەوت لە بیر نەبوو،
مێشکت کەوتە کەڵکەڵەی خەمی نان و بیری داهاتوو،
بزانە کە هەتا دوێنێ
یەکێك، شتێکت خۆشدەویست.

## زایەڵە

من ناتناسم.
لە خۆتم بیست
راپۆرتیان لێدابووی:
ئێوارەیەك لای بیسەرێك درکاندبووت
ئەو رازانەی لای دایك و نەنك و دایکانی وان،
لە پشت دەرگای گاڵەدراوی
متبەق و هۆدە و دیوەخان،
بۆ هەزاران ساڵ شاراوە بوون.

من ناتناسم.
هێشتا روخسارت
مانای نەداوە بە چاوەکانم،
هەناسەشت یاریدەی نەداوم
حەز بە بیستنی پشووی خۆم بکەم و،
سەری زمانیشت
کارەبای نەداوە لە پەڕەی دڵم.

من هەر بە یەک شت دەتناسمەوە:
دەنگت.
هەر بۆیەشە
گوێیەکانم هێندە تامەزرۆی بیستنن.

دە بمدوێنە!

## رستە لەبننەهاتووەکان

مەهێڵە
لە پاشەنگی ڕستە  لەبننەهاتووەکان دا ون بم!
ئێستاکەش ڕانەهاتووم بە سەفەری بێ کۆتایی.

مانا لێکدانەوەی وشەکانت بە من مەسپێرە.
من حەز ناکەم لە درۆ و ڕاڕایی.

ئەتیمۆلۆژیی ڕابردووشم باش دەزانی.
وەبیرم مەهێنەوە تەمەنم چەندە.

وەرە و
دەفتەری نوێی شێعرەکانت بە من دەست پێ بکە!

وەرە و
بمکە بە سەرەتایەک،
سەرەتایەک کە

بەئاواتگەیشتووەکان خەونی پێوە دەبینن!

وەرە و
بمکە بە دەستپێکەی ئەو وشە نوێیانەی
بسکی لاپەڕەیەکی سپی دادەهێنن.

20ی نۆڤامبری 2003

## مەودا

شاعیرە ناکامەکان
یان دەبنە کاسبکار یان رەخنەگر.
ئەویندارە بەزیوەکانیش
یان تەنیا دەمێننەوە یان دەبنە هاوسەر.

من کە لێت نیزیکم
هاوسەرێکم کاسبکار و سەرقاڵ،
کە لێشت دوورم
شاعیرێکم ئەویندار و سەوداسەر.

هاوینی 2004، ئیسپانیا

## پێناسە

هەوڵ مەدە شێوەت لە شێوەم چێ،
ئەگەر بچێ،
نە تۆ دەبی و نە من؛
کە بوونی مە
بریتیە لە یەکنەبوونی تۆ و من.

2005-01-1

## دۆڕاندن

بە شەو
راوێژی نەژاکاوی رۆژ دەمووروورژێنێ،
بە رۆژیش
خەونی خەملێوی خاکەلێوە لە خمم دەدا.

شەوانە،
ئەوین یاری دەکا بە تاوویاوی لە دایکبوونێک.
رۆژانە،
لە دایکبوویەک لە گەڵ ئەوینی شەو یاری دەکا.

لە چوارچێوەی پەنجەرە دا
کریسمەس چەرمووگ دەبێ
وەکوو من لە بەر ئاوێنە دا.
شێعرێکی مەست سەربەست لە سەر سەهۆڵ سەما دەکا،
بێئەوە کە کەسێک لە کڕین راوەستێ،
بێئەوە کە کەسێک لە دۆڕاندن بموەستێنێ.

ژانویەی 2006

## ڕووان

بڵێی ڕەگەکان لە بیریان بچێتەوە
ئەو دارە سەرەڕۆیەی لە هەڕەتی هەڵکشاندا
بە شەقەی بێزاریی لە جەنگەڵ بڕیتان و
بە کۆڵانەکاندا ڕاتانکێشا و
جادەکانتان پێ تووڕە کرد؟

بەرتیلی چی ئەدەن بە ئەم هەموو زیخ و چەوە،
گیا و گوڵ و دار و دەوە،
کە پایەندازی لەشی شەلاڵی شێعری شار بوون؟

چۆن ڕووان لە بیر تۆوەکان دەبەنەوە؟

هەر مەگەر من مل بدەم بە داچەمین
لە ژێر باری لۆمەژەنگەکانی چەک،
حاشا لە خۆمی دوێنێ بکەم و
دەست بدەمە دەستی وشەناسەکان
بۆ پاڕانەوەیەکی درێژ:

سا خوایە ئەتۆ هەڵکەی ئەوێ بایێ ڕەحمەتێ،
بارانێک پەڵەی وەدا

لە وشکەڵانی ئەم خاکە تووکلێکراوەدا،
بەڵکوو خوێنەکان وەشۆرێن،
زمانەکان نەگەڕێن
مەگەر بۆ دەربڕینی خۆشەویستیی،
هەنگاوەکان هەڵنەگیرێن
مەگەر بۆ پێشوازیچوونی ئاشتیی،
دەستەکانیش درێژ نەکرێن
مەگەر بۆ لە ئامێزگرتن.

کە متمانە بە منیش ناکەن،
چەندە هیوادارم خۆتان
لە تۆڵەی
نەمامەکانی
نامۆ بە وشە
بشارنەوە.

## خەونی هەڵاتوو

چەندە دڵاوایانە پاکانە دەکەی
بۆ ئەو بایەی لە هەوارێکی قاقڕدا هەڵیکردووە و
سێپەکی ڕەشماڵەکانی لە هەوردا داکوتاون.
چەندە دڵدەوڵەمەندانە دەگمێنی
بە سەر ئەو کۆڵەوەژبەدەستانەدا
کە گوللەکانیان
لە بەر دەم نەجابەتی پێداگریی و هەیبەتی ناتوندوتیژیت دا
دەتوێنەوە و،
دەبنە کەرەسەی چێکردنی یاریچەیەک
لە کۆشی منالێکی بێ بووکەشووشەدا.

تۆ چۆن دەتوانی خەون بی،
ئەی چاوی زیت و دڵی ئاشقی رۆژهەڵات؟
تۆ چۆن دەتوانی ئاوابی، ئەی خۆری خۆرهەڵات؟
تۆ چۆن دەتوانی بەندیی بی،
ئەی کە قورسایی باستیلەکان لە سەر شانی ورەت
نزم دەنوێنن؟

تۆ خەون نی، خاسەکەویٚ!
کە دەم دەکەیتەوە،
دایکەکان بە ئەشقی داهێنان
زگپڕ دەبن،
مەلیچەکان لە تاوی یاوی فڕین
باڵ دەڕوێنن و
زایەڵەی هیوا و
مزگێنی زیندووبوونەوەی ژن
بە گوێی ڕێبوارانی
شاڕێی وشە و دیالۆگ و شەوچەرەدا
دەچرپێنن.

## ژیان گەمە بوایە

گوتی: ژیان گەمەیە،
هەرکەس هات و هەرکەس کە چوو.

ئەی خۆزگە هەر ئاوا دەبوو.
بەڵام، نەک وەک ئەو گەمانەی لە بیرمان دەچنەوە،
یان ئێمە پیر دەبین، ئەوان مناڵ دەمێننەوە.

خۆزگە ژیان گەمەی ئەلەکترۆنیکی دەبوو،
لە سەر سی.دی. یان دی.ڤی.دی.
بە دوگمەیەک
بوویەرەکانمان رەت یان خێرا دەکردن و
کەرتە نەویستەکانمان دەقرتاندن.
هێدی کۆپی و چەند پاتمان دەکردنەوە،
دەمانگێڕانەوە و لێماندەدانەوە
کەرتە دڵخوازەکان.

بێتوو ئاوا بوایە، هەموو ڕۆژێ یاریم دەکرد،
کۆپی و چەند پاتەم دەکردنەوە، هێدی هێدیم دەکردنەوە، تێر
تێر سەیرم دەکردن:
ئەو ڕۆژەی بیری کردەوە
منالێک بەر لە گەورە بوون،
ڕووبارێک بەر لە خوڕین،
چرۆیەک بەر لە پشکووتن،
مەلێک بەر لە فڕین.

کۆپی و چەند پاتەم دەکردنەوە، هێدی هێدیم دەکردنەوە، تێر
تێر سەیرم دەکردن:
ئەو دوا جارەی دایکم لە باوەشی کردم،
ئەو یەکجارەی گۆیا باوکم بۆنی پێوەکردبووم،
ئەو چەند چرکەیەی،
بەیانییەک لە ڕێی فێرگە، شازدە ساڵە بووی و
خەواڵوو تۆ،
شار کەڕ،
من لاڵ و بێگۆ،
شێعرێکی نوێی ئۆقرەلێهەڵگیراوم لە دەستا بوو بۆ تۆ،
چەند هەنگاوێک مابوو تێپەڕ بی لێم.

بەهاری 2005

## خەونی بێخەبەریی

چەندە شێتم، چەند شەیدا، بۆ پشوودانێک لە تەک تۆدا.
پشوودانێک لە بەستێنی بێخەبەریی،
بێخەبەریی لە ژمارە،
لە زەنگی وەخەبەرهێنانی بەیانییان،
لە خاوەنکار،
لە بەشخوران و
بێخەبەریی لە چاوبرسیبوون.
بێخەبەریی لە دەنگوباسی بزربوونی مرۆڤکوژێک،
لە وڕێنەی رەگەزپەرەستێک و،
لە یەکتر تێنەگەیشتن.

بێخەبەریی لە یەکتر دڕدونگبوون.

پشوودانێک لە بەستێنی شلبوونەوە
لە چاکوچۆنی کردن و ماڵاوابییکردن دا.
شلبوونەوە لە پیر بوون،

لە ئاشنابوون لە گەڵ هەناسەکان و،
شلبوونەوە بۆ وەبیرهێنانەوەی بۆنی پەلکێک نان
پاشی سەفەری حەوت رۆژەی بێگاری لە چیاکانی کوردستان.
شلبوونەوە لە سەفەری مردن.

پشوودانێک لە بەستێنی لێبوردوویی لە خۆ
بۆ بڕوا کردن بە رووناکایی شەو، بە گەرمای زستان،
بە ئەنجامی داستانە گەورەکان، بە بەزەی دیکتاتۆر،
بۆ بڕوا کردن بەو زڕڕە-رۆشنبیرەی
کە رۆژئاوا وەخۆی نەکرد و
گەڕاوە و، دەستی کرد بە هۆنینەوەی فەلسەفە
بە پینەوپەڕۆی چاکەکانی کوردستان.

منداڵەکان خەوتوون.
چراکان کووژاونەتەوە.
زبڵوزاڵ فڕێ دراوە.
بەرەو ژێرزەمین دەخوشێم.
لێم ببوورە هاوژین!
ئەوشۆ نایەمە ژوانی بە پەلە.
بە خەبەر دەمێنمەوە
کە پشوویەک بدەم و، نەم نەم، شل شل،
خەونی بێخەبەربوون لە کۆتایی شەودا دەستەمۆ کەم.
ئاگۆستی 2006

## دێوجامە

کەی دێوجامە فڕێ دەدەن
ئەیش، بەڵکوو باڕەکان هەلی فڕینییێکی نوێیان بۆ بڕەخسێ؟
هەتا ڕووگەیان شاشەکانی ئێوە بێ، هەر گێلتر دەبن.

کەی بە پەلەوەرەکان دەڵێن کێن ئێوە؟

بەڕاست کێن ئێوە؟[5]
کاغەزی کامە زبڵخانەتان کاوێژ کرد؟
سەرنێزەی شەلاڵ بە خوێنی کامە شڤالییەی بەزیو
کەوتە دەستتان؟
تفی کامە شەیتان، کامە شەڕانیی، کامە عەشیرەت بە
گەرووتان دا کرا؟
کێن ئێوە، کە ئا بەم چەشنە دەڕشێنەوە بە سەر
وشە و شێعر و شەڕاب دا؟

---

[5] سوارەی یەلخانیزادە شێعرێکی هەیە کە ئاوا دەست پێدەکا: "ئێوە کێن ..." لە بەر ئەوە رەنگە ئەو "کێن ئێوە"ی من ئەو شێعرەی سوارە وەبیر بێنیتەوە. بەڵام شێعرەکان زۆر جیاوازن لە یەکتری، هەم لە ئاستی ئەو کەسانەی کە رووی قسەمان تێیانە و هەمیش کاکڵی شێعرەکانمان.

هەر ئێوە نەبوون
کە پۆلووی نێرگیلەتان لە تکریت قرچەی دەهات؟
تفتان
لە هەرچی هێمنایەتیی و ئاشتیی و حەسانەوەیە دەکرد؟

هەر ئێوە نەبوون
دەشتە کاکییەکاکییەکانی جنووبتان
لێ بوون بە زرێ و،
هەنگاوە نەفامەکانتان سپاردە هەتڵەڕێ؟

کێن ئێوە؟
پەروەردەبووانی ناو بێشکەی ڕازاوە بە چەقۆ و شیر و بڕنۆ!
مردووپەرستانی ئاوەدانکەرەوەی قەبرستان!

با ڕەوایەتیشتان بە قوڕپێوان بۆ چوارەکان بسەلمێنن،
دەتانبینم: چاوەڕێ، لەوبەر هێڵی لە خۆتان قەڵبتر،
وەکوو تاژی دابەستە،
لیکاوتان شۆڕ بۆتەوە:
ئاخۆ خاتوونەکی "سەربەستیی"
کەی لێتان رادەکێشێ رستە.

ئێوە هیچکات بڕواتان نەکرد
بە تامەزرۆیی دارستان بۆ ڕووان و

بۆ حەسانەوە لە نێو پەرژینێکی چوارگۆشەی خۆماڵیدا.
ئێوە نەتانویست بڕوا بکەن کە دایکان دڵیان خۆشە
نەک بە لەشی چوارپارچەبووی جگەرگۆشەیان،
بەڵام بزەیان.
ئێوە هیچکات بڕواتان نەکرد بەو کتێبانەی
کۆترەکان دەیانگماند
لەو بەیانییە ساوەدا،
بەر لە شەڕ،
کە ئاسمان نوقمی تەقڵە بوو.

لەو رۆژەوە عەقڵتان لە چەک مارە کرد،
دارستان بوو بە پاشکۆی گۆڕستان،
ژیان ئی مەرگ،
ژن ئی کۆپۆن و نۆبەی نانەواخانە،
پیاو ئی تۆڵە و کەللەویشکی،
منداڵ ئی بێبەزەیی،
دروشمەکانی ئێوەش
ئی شێعرەکانی من.

ئاگوستی 2006-08-22

## شار و چیا[6]

هۆی خاڵە ڕێبوارە "سەرگەردان"ەکەی شار!
ئەگەر "شەقامەکان فێری سەرگەردانییان" کردی و
"دارەکان فێری سەرشۆڕی" و
"دارتێلەکان فێری وەنەوزی سەرپێیی"،
ئەوانەی کە پشتیان کرد لە شار
نە پێیەکیان ماوە کە سەری لە سەر بەرز کەنەوە،
نە سەرێک کە بیگێڕن.

پێیان گوتین: تەنیا چیاکان دۆستمانن.

بڕوامان کرد ساویلکانە.
چراکانمان کووژاندنەوە بە پەلە،
کتێبەکانمان سووتاندن بە نەهێنی،
قەڵەمەکانمان کردن بە سەرنێزە و
باسکەکانمان بە بڕنۆ.

---

[6] دیالۆگێکی خەیاڵکراو لە گەڵ شێعری "شار"ی عەلی ئیسماعیلزادە، گۆڤاری مەهاباد، ژ. 64، ل. 36 دا.

ئەمجار
گێژ بووین لە توێی توولەڕێ و کوێرەڕێکاندا.
دەسرپێژمان کرد لە خوشک و برای خۆ.
خەونمان دیت بە ژاندارک و ئاکسینیناکانەوە
لە ناو ئەشکەوتە تاریکەکاندا.
لە کۆمەڵگەی مەدەنی و شارستانییەت دووایین
لە گەڵ شارنەدیوەکان
لە ناو زەندۆڵە خۆرنەدیوەکاندا.
بێخەبەر ماین
لە شار،
لە چرا،
لە داستان؛
ترساین لە گۆڕان،
لە بە روونیی و رووتیی دیتن و
لە بە روونیی و رووتیی دیتران.

ئووتی 2006

# نیشتمان

نیشتمانەکان ئیتر ئەو شوێنانە نین کە لێیان دەژین،
بەڵکوو ئەوانەن کە بەجێیان دێڵین.

شێعرەکانم ئەمانە نین کە تۆ دەیانخوێنیتەوە
یان دەیانبیسی،
بەڵکوو ئەوانەن کە هەرگیز نانووسرێن.

ماندوو بووم لە بەجێهێشتن.
مەیە ئێرە!
پەیامێکی دیجیتاڵیم بۆ بنێرە!

31ی ئۆکتۆبری 2006

## پاشی ٢٥ ساڵ

وامدەزانی ئەگەر بتبینمەوە
پاشی ٢٥ ساڵ،
هەروەک پەشێو،
لە "دار، بەرد، گڵ، قوڕ،
چیم بێتە ڕێ دەیلێسمەوە".

وامدەزانی ئەگەر بتبینمەوە
پاشی ٢٥ ساڵ،
هەروەک هێمن،
بە دیداری باوان، دێد و کاکان
شاد دەبمەوە و
"بێستانی کورد" بە شەو دەڕنمەوە.

وامدەزانی ئەگەر بتبینمەوە
پاشی ٢٥ ساڵ،
وەک جگەرخوێن،
دەچمە سەربەرزایی "بورجی کەچک"
هاوار دەکەم:
بەلکی نها ئەز دزانم "کینە ئەم".

کە دیتمی
لە زمان کەوتم،
هەرکەس بینیم دۆستێکی گیانی بوو،
باوان و کاک و دێدم بوو،
دڵی دەدامەوە.
خۆم خستە باوەشی گەرمت،
هێدی هێدی تێیدا توامەوە.
بووم بە دار وبەرد و گڵ و قوڕت
لە ڕێگە و بانتدا تلامەوە.
لە نزیک دیواری قەڵا،
لێرە و لەوێ
بە بیستنی پەیڤی کوردی
ژیامەوە.

ئامەد، 5ی مارسی 2012

## Paşî 25 sal

Min wilo seh dikir heke dîsa te bibînim
paşî 25 salan
mîna  Peşêw
ezê "dar, kevir, gil, herî yê te
u her tişt were ser rêya min ezê bialêsim"

Min wilo seh dikir, heke dîsa te bibînim
paşî 25 salan
mîna  Hêmin
ez dê şa bim bi dîtina bav u kalan, dêd u kekan
Ezê bi şev ji "bostana Kurd" helînim

Min wilo seh dikir, heke dîsa te bibînim
paşî 25 salan
mîna Cigerxwîn
ezê biçim ser berzahiya Burca Keçik
biqêrim:
belkî niha ez dizanim "kîne em?"

Ku min te dît zimanê min ket
Her kesî min dît dostek canî bû
bav u kal u kek u dêda min bû
Min xwe awêt hembêza te
hêdî hêdî ez têda haliyam
Ez bûme dar u kevr u gil u herî
di  kolan u rêkên te de ez şil bûm
Li cem şûra kela te
li nêz u dûr
bi bihîstina peyvên Kurdî
min carek din jiyan seh kir

2012-03-05 Amed

سپاس بۆ ح. ق. کە ئەو شێعرەی هێنایە سەر کورمانجی

## باران

کە دەتهەوێ بۆ هەتاهەتایە شارێکت لە بیر نەچێ،
جاری یەکەم
سەری لێ هەڵێنە
لە رۆژێکی بارانیی دا.

کە دەتهەوێ بڕوا بکەی دارەکان باشترین رازداری تۆن،
ڕاکە لە دەست قرمژنی دەمەچەقەیەک، سێرەی چاوەدێرێک،
یان تەقینەوەی تەنیاییەک؛
خۆ باوێژە باوەشی کووچەباغێکی دوورەدەست،
لە ڕۆژێکی بارانیی دا.

کە دەتهەوێ نازەنینێک بکەی بە بووکی نۆستالژی ئەبەدیت،
لە گەڵی بچوو بۆ پیاسەیەک
بە درێژایی جادەیەکی هەنگاو-خۆشەویست کە
باڵای بە باڵای ڕووبارێک دەگرێ،
لە رۆژێکی بارانیی دا.

بەڵام،
کە بارگەت تێک دەنێی بەرەو شارەکە،
کە سەری خۆت هەڵدەگری بەرەو کووچەباغەکە،
کە دڵت وەپێش خۆت دەکەوێ بەرەو جێژوانەکە،
لە بیرت بێ کە لە بیرت چێ
چەترێک دەگەڵ خۆت هەڵبگری.

ئۆتاوا، 2ی ئاوریلی 2012

## Deserted Soul

All thy tears wash an overwhelming blaspheme,
and impute my sin to your
half-deserted soul.
Do not enmesh me
before God beset the road to blessing,
and
Ask no more about my conscious
Crawling up the candles of indulgence
In the dreary and baffle darkness of this divine,
this "inverted bowl".
We joined thousands of years ago
To wonder in this magic shadow-show
Asking why being born, why death, why come and why go?
We precipitate to discover
Afraid of utterly become a part of this pernicious show.
We vacillated impotently
In the eternal predestination question
as "patient etherized",
in a box,
restless,
having no vision of light,
Nothing to provoke, nothing to tell,
Having any hope out of sight.
Why we came? Why we go, when and how?
no one has got it right.
Oh, let's go then, you and I
And wonder in strange streets
Visit smoky restaurants,

scary neighbourhoods,
invite the sun to our deserted table,
become "restless in cheap hotels", and
let thy hands and moving fingers fall to sin
and figures follow for help…
Thou who spread out the tender moon in the murkiest night in pain
Deceive Michelangelo with your senseless figure
after a deep, soaking swim
in the morning Gin,
certain of your snare set the night before
for the future father of the another confused, helpless animal
with the eternal question
in the mystical jungle of this universe.
"Let us go then, you and I",
and dare to die
In a night dared to make it with pitfalls, sins, blaspheme, love, daring,
shadow, questions, and pregnant with the most anomalous morning,
When the myriads resent the muttering retreats, and
We phantom through the unsaid words.

1999

**Note:** some words and phrases in this poem are direct borrowings from Omar Khayam, the Persian poet, and T.S. Elliot.

## Homelessness

"Homelessness is a guilty pleasure," said the free soul
"The envy of those who are eternally curious about journeys"
Those who need home see the world through narrow windows
"Statehood is an opportunity to love the land that is not yours"
Continued the free soul
"And get away with hating 'them' in the name of 'us'
Who are seldom 'we'"
Statelessness is the envy of those who wake up to nightmares
Of murdering and raping
In the name of the homeland

Oh, my beloved!
How comforting it would be
Not to be asked for a fixed address
How liberating it would be
To see you at the crossroads of untaken paths

April 2009

## Homelands

Homelands are no longer where we live
But the places we long to belong

We're no longer in a place
But spaces in-between
Places? We preserve within

My poems may not be what you read or hear but those that
will
never
be uttered

Oh, so exhausted I am of departing,
like a branch in the claws of a tornado
Come to me not!
Send me a digital message.

2006



من کێم؟ نیزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر، لە گوندێکی نزیک شاری مەهاباد، لاچین، لە دایک بووم. بڕیار بوو ببم بە ئەندازیار، بەڵام، هەرچەند هەوڵی خۆشم دا، نەبووم. هەر لە مێرمنداڵییەوە ئۆگری شێعر و هونەر و زمان بووم. لە سەرەتای هەشتاکاندا، چەند ساڵێک لە رادیۆ کوردییەکاندا وەکوو نووسەر، وەرگێڕ، سیناریۆ نووس، ئەکتەری شانۆ و وێژەر کارم کرد. لە شوێنی دیکە و بۆ مەبەستی دیکەش شێعر و کورتە چیرۆک و وردەوتارم نووسین و هەندێکیانم لە گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکاندا بڵاو کردنەوە. یەکەم "شێعر"م، کە مامۆستا هێمن گوتی "بۆنی شێعری لێدێ"، هاوینی ١٩٧٩ نووسی: "خۆشەویستم، زۆر جار ویستم ..." یەکەم کۆمەڵە شێعرم، چیا و کۆچ و چەمەر، ساڵی ١٩٩١، لە کەنەدا چاپ کرد. هەر لە سەرەتای نیشتەجێبوونمەوە لە کەنەدا دەستم کرد بە خوێندنی باڵا لە چەند بواردا، وەکوو کتێبخانە و ئاگاداریی (سەروو دیپلۆم، ١٩٩٣)، زمانناسی (لیسانس/ بەچلر، ١٩٩٨)، بەڵگەنامەی مامۆستایەتی زمانی ئینگلیسی (CTESL,١٩٩٩)، زمانناسی کارکردیی/کارەکی (فوق لیسانس/ماجستێر، ٢٠٠١) و، پاشانیش میدیا و پێوەندەگشتییەکان (دوکتۆرا، ٢٠٠٨). زۆربەی نووسینە ئەکادیمیەکانم بە ئینگلیسی بڵاو بوونەتەوە، وەکوو
Kurdish Identity, Discourse and New Media. 2011. New York: Palgrave M.
ئێستاش هەر لە کەنەدا دەژیم. لە زانکۆی کارلتۆن، شاری ئۆتاوا، لە بوارەکانی زمانناسیی کارەکی و شیکردنەوەی دیسکۆرس دا وانە دەڵێمەوە. زۆربەی نووسین و لێکۆڵینەوەکانم لە پێوەندی لەگەڵ کورد و کوردستان و لەم بوارانە دان: زمان و دەسەڵات، زمان و پێناسە، پلاندارێژیی و بەرنامەدانان بۆ زمان و نەتەوە دامەزراندن و هتد. ژیانی ئەکادیمی کەمتر مەودای بۆ هێشتوومەوە کە شێعری بنووسم. شێعر لە من بەوەفاتر ماوەتەوە؛ بەخێرا خۆی، جار و بارە، سەرێکی لێ هەڵێناوم. "سایەی کەم نەبێ".